زنجیرەی
زانستەکانی
کۆمپیوتەر
٨

# ڤیژوەل بیسك






ئامادەکردنی
فوزی معروف عبداللە ئیروانی

١٤٢٥ هەولێر ٢٠٠٤

ناوی کتێب: فیژوەل بیسک
ئامادەکردنی: فوزی معروف عبداللە ئیروانی
کۆمپیوتەر: بەشی سیستەمی کۆمپیوتەر-هەولێر
تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
چاپ و بلاوکردنەوەی: نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر
ژمارەو ساڵی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٤
چاپکردن: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر
تیراژ: ١٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٥٠٤ ساڵی ٢٠٠٤

التفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
تەلەفون: ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٢٢١٦٩٥
مۆبایل: ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢٩١
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا

إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ

# پێشەکی

لەبەر ئەو کارە گرنگەی کە کۆمپیوتەر دەیکا لەسەر ژیانی تایبەتی و گشتی مرۆڤ لەو سەردەمەی کە ئێمە تێیدا دەژین دەگوترێت سەردەمی کۆمپیوتەر، چونکە لەزۆربەی بوارەکانی ژیاندا بەکاردەهێنرێت لەشیکردنەوەی کاری بیرکاری و کۆکردنەوەو داکردنی زانیاریەکان و راپەراندنی سەدان کاری رۆژانەی مرۆڤ وەک بوارەکانی تەندروستی و پەروەردەو فێرکردن و.......... هتد.

لەبارەی پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسک) تاوەکو ئێستا زانیاریەکی وا بەزمانی کوردی بڵاونەکراوەتەوە لەبەر ئەوە بەپێویستم زانی، کە ئەم نامیلکەیە بخەمە بەر دەستی خوێنەران بۆ ئەوەی بەزمانی کوردی زانیاری هەبێ لەسەر پرۆگرامێکی بەرنامەسازی (برمجە). بەرنامەسازی یەکێکە لەزانستە گرنگەکانی کۆمپیوتەر. ئەگەرچی زانستی کۆمپیوتەر زۆر لەمێژە نییە پەرەی سەندووە لەنێو کوردستاندا، بەڵام ئەوەی جێگای دڵخۆشییە ئەمڕۆ بە دەیان پەرتووک لەسەر ئەم زانستە چاپ و بڵاوکراونەتەوەو، گۆڤارێکی مانگانەی تایبەت بە زانستی کۆمپوتەر و ئەنتەرنێت بەزمانی کوردی دەردەچێت.

خوێنەری هێژا: ئەمە ئەوە نییە کە لە داهاتوودا دەمەوێت، بەڵکو ئەوەیە کە جارێ هەر ئەوەندەم لەدەست هاتووە. ئەم نامیلکەیە تەنیا چرایەکە بۆ چوونە ناو جیهانی پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسک) و کلیلی

دەروازەی چوونــە نــاو ئــەم پرۆگرامەیــە. بــەکورتی زانیارییــەکی سەرپێیانەت دەداتێ سەبارەت بەناسین و چۆنیەتی ئیشکردن لەناو ئەم پرۆگرامـە و زۆرلایـەنی دیکـەی. ئومێدەوارم کـەوا رەزامـەندی خوێنەری بەرێزم بەجێ هێنابێ بە هەندێ روون کردنەوە لەبارەی ئەم پرۆگرامە. خوداش لەپشتەوەی مەبەستەکانەو هەر بەپشت و پەنای ئەو دەست پێدەکەم.

لەکۆتایشدا رێزو سوپاسی تایبەتیم هەیە بۆ سەرۆکایەتی بەشی (سیستەمی کۆمپیوتەر) لە (پەیمانگای تـەکنیکی هـەولێر)، چونکـە زۆر یارمەتیان داوم، هـەروەها سوپاسـی نوسـینگەی (تەفسیر)یـش دەکەم ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم نامیلکەیان گرتە ئەستۆ. خوا پاداشـتیان بداتـەوە، هـەروەها سوپاسـی سـەرجەم ئـەو بەرێزانـەش دەکەم کەوا هاندەرو هاوکارم بوون بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارەکەم.

هیوای سەرکەوتن بۆ گشت لایەك دەخوازم............

ئامادەکار

فوزی معروف/ئیروانی

# پێرست

## سەرەتای چون بۆ ناو پرۆگرامی ( ڤیژوەل بیسك ):-

١- سەرەتا کۆمپیوتەرەکەت بەئیش بخە چاوەڕێ بە، تا ڕووی شاشەکە بە جوانی دەردەکەوێت.

٢- پاشان کلیك لەسەر لیستی (Start) بکە، دوای لیستێك دەکرێتەوە تۆ بچورە سەر لیستی (Programs) و کلیك لەسەر (MicroSoftVisualStodio) بکە دوایی (MicroSoftVisualBasic) هەڵبژێرە، وەك لە وێنەی(١-١) دا دیارە:-




وێنەی(١-١)ڕووی سەرەکی ڤیژوەل بیسك

٣- پاش ئەنجامدانی ئەم کردارانەی سەرەوە ئەم شێوەی خوارەوەمان بۆ دەکرێتەوە، کە لەوێنەی (١-٢) دا دیارە:-




وێنەی(١-٢)

٤- لەوێنـەی سـەرەوەدا (Standard-Exe) هـەڵبژێرە و کلیـك لەسـەر (Open) بکـە، کـە ڕووی سـەرەکی (ڤیـژوەل بیسـك) دەکرێتـەوە وەك لەوێنەی (١-٣) دا دیارە:-



وێنەی (١-٣)

ڕووی سەرەکی (ڤیژوەل بیسک) پێکهاتووە لە کۆمەڵێك پەنجەرەو ئامرازی تایبەتی، گرنگترینیان ئەمانەن:-

١. پەنجەرەی فۆرم (Form) .
٢. سندوقی ئامرازی کۆنترۆل (ToolBoxControls) .
٣. پەنجەرەی تایبەتی(PropertiesWindow)
٤. پەنجەرەی دۆزەرەوەی پرۆژەکان ( ProjectExplorer ).
٥. شریتی لیستەکان (MenuBar).
٦. شریتی ئامرازەکان (ToolBar) .

جا بەکورتی باسی هەریەك لەم پەنجەرەو ئامرازانە دەکەین:-

### (١-٢) پە نجەرەی فۆرم ( Form ) :-

بریتی‌یە لەشوێنی سەرەکی کارکردن لەناو پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسک) بۆ دروست کردنی بەرنامەیەك، یان کردارێکی جێبەجێ کردن، دەتوانین بەهۆی ئامرازی تری وەك (سندوقی نوسین (TextBox) و سندوقی ناونیشان (Lable) بەرنامەکە جێبەجێ دەکرێت ...هتد). وەك لەوێنەی (١-٤) دا دیارە:



وێنەی(١-٤)



وینەی(١ –٥)

## (١-٣) ئامرازی کۆنترۆل ( Controla ):-

بریتی‌یە لەئامرازەکانی کۆنترۆل کردنی کردارەکانی سەرەکی بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەکان، کە لەناو (ڤیژوەل بیسک) دا دەکرێت. بەهۆی ئەم ئامرازانە دەتوانین بەشێك لە کردارەکانی خۆمان جێبەجێ بکەین، ئەم ئامرازانەش بریتین لەم ئامراز و فەرمانانەی، کە لەخوارەوە بەکورتی باس لەکارو ئەرکیان دەکەین. وەك لەوێنەی (١–٥) دا دیارە:-

**گرنگترین ئەرکی هەریەك لە ئامرازەکان:-**

١. سندوقی وێنە (Picture Box) :-

ئەم ئامرازە بەکاردێت بۆ پیشاندانی وێنە، دەتوانین لەجیاتی ئامرازەکانی تریش بەکاری بێنین.

٢. ئامرازی نیشاندەر (Pointer):-

بۆ بەکارهێنانی ئامرازەکانی تر بەکاردێت.

٣. سندوقی نوسین (Text Box):-

بۆ نوسینی ناو، یان ژمارە بەکاردێت، کە دەمانەوێت لە کردارێکدا بەکاری‌بێنین.

٤. ئامرازی ناونیشان (Lable) :-

بۆ نوسینی ناونیشانی ئەو کردارانە بەکاردێت، کە ئەنجامیان دەدەین.

٥.دوگمەی فەرمانەکان (Command Button):-

بریتی‌یە لەگرنگترین ئامرازەکانی کۆنترۆل، کەبەکاردێت و دەتوانین بە هۆیەوە زۆرترین کردار جێبەجێ بکەین.

٦.پرۆگرامی یارمەتیدەر (Sub Form) :-

وەك یارمەتیدەرێك بۆ ئامرازەکانی تر بەکاردێت.

٧.ئامرازی هەڵبژاردن ( Option Button):-

بەکارهێنەر دەتوانێت ئەم ئامرازە بەکاربێنێت لەبری کۆمەڵێك کردار، کە دەتوانین تەنیا یەك کردار هەڵبژێرین.

٨.سندوقی (Check Box):-

بەکارهێنەر دەتوانێت بەهۆی ئەم ئامرازە وە کۆمەڵێك کردار جێبەجێ بکات، کە ئەمەش پێچەوانەی ئامرازی هەڵبژاردنە (Option Button) .

٩.سندوقی لیستەکان (List Box):-

بەکارهێنەر دەتوانێت بەهۆی ئامرازەکانی تر لیستێك نوسین ئامادە بکات و، لەناویدا زیاد بکات و رەشیان بکاتەوە.

١٠. ئامرازی (Combo Box):-

ئەم ئامرازە بۆ ئەوە بەکاردێت وەك ئەوەی بتەوێت لیستێك بکەیتەوە، بەڵام ئەمە جیایە لە (ListBox) بەوەی کە دەتوانین لەناویدا بنوسین و کردارەکان هەڵبژێرین.

١١.ئامرازی شریتی ستونی (Vertical Scroll Bar):-

بۆ دیاری کردنی درێژی (Form) هکە بەکاردێت، یان زانیاریەکانی وەك رەنگەکان و ژمارەکان بەشێوەی ستونی.

١٢.ئامرازی شریتی ئاسۆیی (Horizental Scroll Bar) :-

بۆ دیاری کردنی درێژی (Form) ەکە بـەکاردێت، یـان زانیاریـەکانی وەك ڕەنگەکان و ژمارەکان بەشێوەی ئاسۆیی.

١٣.سندوقی بەکار خەری یادگا (Driver List Box) :-

بەکاردێت بۆپیشادانی ناوی (قرص)ەکان وەك (a:,c:,e:) .

١٤.ئامرازی کاتژمێر (Timer) :-

بۆ دانانی کاتی دیاری کراو بەکاردێت ئـەو کـردارە، کـە دەمانـەوێت ئەنجامی بدەین.

١٥.ئامرازی سندوقی فایل (Files List Box):-

بۆ دیاری کردنی فایلەکان بەکاردێت، کە لەناو فۆلدەرەکان دا هەیە.

١٦.ئامرازی سندوقی فۆلدەر (Directory List Box) :-

بەکارهێنەر دەتوانێت بەهۆیەوە لە دوای فۆلدەرەکان بگەڕێت، کە لەناو (قرص)ەکان دا هەن.

١٧. ئامرازی هێڵ (Line):-

بەهۆیەوە دەتوانین هێڵێك لەناو (Form) دروست بکەین.

١٨. ئامرازی وێنەی ئەندازەی (Shapes):-

بەهۆیەوە دەتوانین کۆمەڵێك وێنە وەکو (بازنە و چوارگۆشە و لاکێشـە) زیاد بکەین بۆ(Form) .

١٩. ئامرازی کۆنترۆڵی بنچینەی داتا (Data) :-

بـەکاردێت بـۆ پشـاندانی زانیـاری (خـزن) کـراو لـە پرۆگرامـی (Micro Soft Access) .

٢٠. ئامرازی وێنە (Lmage) :-

لە ئامرازی (Picture box) دەچێت، بەڵام بەوە لێی جیادەکرێتەوە، کە سیفاتی (Stretch) هەیە، کە بەهۆیەوە دەتوانین وێنە یەك بە ئامرازەکە پیشان بدرێت.

٢١.ئامرازی کۆنترۆل کردنی پرۆگرامە جێبەجێکاریەکان (OLE) :-

دەتوانـــین بەهۆیـــەوە پرۆگرامـــە جێبەجێکاریـــەکانی وەك (MicroSoftExcel) لەناو پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسك) دا بکەینەوە.

تێبینی:-

بەهۆی ئەم دوو رێگایەی خوارەوە دەتوانین ئامرازەکانی کۆنترۆل کردن (Controls) لەناو (Form) دابنێین:-

١. بە (Double Click) لەسەر ئەو ئامرازەی، کە دەمانەوێت بەکاری بێنین لەناوەراستی (Form) ەکە دەردەچێت.

٢. بە (Click) کردن لەسەر ئامرازی خوازراو دوای کلیك کردن لەسەر (Form) بێ ئەوەی دەستمان لەسـەر کلیك هەلگرین رای دەکێشین، تا شێوەی گونجاومان بۆ دەردەچێت ئنجا دەستمان هەڵدەگرین.

## (١-٤) پەنجەرەی دۆزەرەوەی پرۆژەکان (Project Explorer):-

گرنگترین کارەکانی پەنجەرەی دۆزەرەوەی پرۆژەکان بریتی‌یە لەم خاڵانەی خوارەوە:-

١. بۆ دەرکەوتنی (Form) کلیک لەسەر (View Object) دەکەین.

٢. بۆ دەرکەتنی پرۆگرامی فەرعی (Modules).

٣. بۆ دەرکەوتنی (Code) ی پرۆگرام کلیک لەسەر (View Code) دەکەین.

٤. بۆ جێگۆرکێ لەگەڵ فۆڵدەر و فایلەکان کلیک لەسەر (Toggle Folder) دەکەین. وەک لەوێنەی (١-٦) دا دیارە:-




وێنەی (١-٦)

## (١-٥) شوێنی دەرچوونی فۆرم (The Form Loyout Window) :-

بریتی‌یە لەدیاری‌کردنی پەنجەرەی فۆرم لەسەر شاشەکە و شوێنی دەرکەوتنی دوای‌جێبەجێ کردنی (Run)، دەشتوانین شوێنی فۆرم بگۆڕین بۆ بچووکردن و گەورەکردنی بۆ ئەوەی وێنەکە بکەوێتە ناوەڕاست شاشەکە، وەك لە وێنە (١-٧) دا دیارە:-



وێنەی(١-٧)

## (١-٦) پەنجەرەی سیفاتەکان( تایبەتمەندیەکان )
## (Properties Window):-

پەنجەرەی سیفاتەکان پێك دێت لەم سیفاتانەی، کە لەوێنەی (١-٨)دا دیارە:-




وێنەی(١-٨)

هەر ئامرازێك لە ئامرازەكانی كۆنترۆل (Controls) هەندێك سیفاتی تایبەتیان هەیە كەوا هەندێك لە سیفاتەكان لەم خشتەی خوارەو دا دیاری دەكەین:-

| سیفاتەكان Properties | كارەكەی |
|---|---|
| Name | بۆ دەست نیشان كردنی ناوی ئامرازەكە بەكاردێت. |
| Appearance | بەكاردێت بۆ گۆڕینی جۆری ڕەنگی (Form) بۆ ڕەنگی پێشتری، وە پێك دێت لە (0-flat ) و (1-3d). |
| Enable | بریتیە لە (True-False) ئەگەر (True) بوو، ئەوا (Code) ەكە كارا (فعال) دەبێت، بەڵام ئەگەر (False ) بوو ئەوا (Code) كارا(فعال) نابێت. |
| Back Color | بۆ ڕەنگ كردنی ئامرازەكان و فۆرم بەكاردێت. |
| Caption | بۆ گۆڕینی ناونیشانی ئامرازەكان بەكاردێت. |
| Font | بۆ دیاری كردنی جۆرو قەبارەی ئەو (Font) ەی بەكاردێت، كەدەمانەوێت بەكاری بێنین. |
| Fore color | بۆ دیاری كردنی ڕەنگی نوسینەكە بەكاردێت. |
| Height | بۆ دیاری كردنی بەرزی ئامرازی كۆنترۆلەكان بەكاردێت. |
| Left | بۆ دیاری كردنی درێژی لای ڕاستی ئامرازی كۆنترۆلەكان بەكاردێت. |

| | |
|---|---|
| Widt | بۆ دیاری کردنی پانی ئامرازی کۆنترۆڵەکان بەکاردێت. |
| Visible | بۆ دەرکەوتن و شاردنەوەو (Show-Hide) ئامرازی کۆنترۆل بەکاردێت بەهۆی حاڵەتی (True) بۆ دەرکەوتنی (Show) و (False) یش بۆ شاردنەوەی (Hide) . |
| Right to Left | بریتی‌یە لە دوو هەلبژاردن (True-False)، ئەگەر (True) بوو، ئەوا نوسینەکە لە ڕاستەوە دەگۆڕێت بۆ چەپ بەڵام ئەگەر (False) بوو ئەوا پێچەوانە دەبێت. |
| Max Button | بریتی‌یە لە دوو هەلبژاردن (True-False)، ئەگەر (True) بوو ئەوا ئەم دوگمانە لەسەر (Form) دەبێت، بەڵام ئەگەر (False) بوو ئەوا پێچەوانە دەبێت. |
| Control Box | بریتی‌یە لە دوو هەلبژاردن (True-False)، ئەگەر (True) بوو ئەوا ئەم دوگمانە لەسەر (Form) دەبێت، بەڵام ئەگەر (False) بوو ئەوا پێچەوانە دەبێت. |
| Font under | بۆ ئەوەی هێڵێک لەژێر نوسینەکەمان بێت بەکاردێت. |
| Font Bold | بۆ دەرکەوتنی نوسینەکەمان بە تۆخی بەکاردێت. |
| Font Italic | بۆ گۆڕینی شێوەی نوسین بۆ لار (مائیل) بەکاردێت. |

| | |
|---|---|
| Top, Left | بۆ دیاری کردنی شوێنی ئەو ئامرازە بەکاردێت، کە بەکاری دێنین لەپەنجەرەی فۆرم ئەگەر لەسەرەوە بوو ئەوا (Top) و بۆ لای ڕاستی شاشەکە (Left) هەڵبژێرە. |
| Max Length | بۆ دیاری کردنی ژمارەی ئەو پیتانە بەکاردێت، کە دەمانەوێت لەناو سندوقی نوسین (Text Box) دا بنوسین. بۆ نمونە ئەگەر ژمارە (٦) مان دانا، ئەوا دەتوانین تا (٦) پیت بنوسین. |
| Multi Line | بەکاردێت بۆ ئەوەی بتوانین زیاتر لە دێرێك لە (Text Box) دا بنوسن، ئەویش بە دیاریکردنی (True)، بەلاّم ئەگەر (False) تەنیا یەك دێر دەتوانین بنوسین. |
| Cancel | بەکاردێت لەگەلّ (Gommand Button)، کەلە دووهەلبژاردن پێکدێت (True-False) ئەگەر (True) بوو، ئەوا لەکاتی کلیك کردن لە سەر فەرمانی (Command Button) کۆتایی بە پرۆگرامەکە دێنێت. بەلاّم ئەگەر (False) بوو ئەوا پێچەوانە دەبێت. |

## بەشی پراکتیك

### پرۆگرامی یەکەم:- لەسەر ئامرازی (Text Box):-

بـۆ کۆکردنـەوەی دوو ژمـارە بـە بـەکارهێنانی ئامرازەکـانی (Text Box,Lable,Command Button) ؟

TextBox :- بۆ دانانی ژمارەکان و دەرچوونی ئەنجامی کۆکردنەوە بەکاردێت.

CommandButton :- بـۆ جێبـەجێ کردنـی کـرداری کۆکردنـەوە بەکاردێت.

هەنگاوەکان کار کردن:-

١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).

٢. ئامرازەکـانی (TextBox,Lable) هەریەکـەیان سـێ دانـە زیـاد دەکـەین بـۆ فـۆرم، و یـەك ئـامرازی (CommandButton)یـش زیاد دەکەین، وەك لـە وێنـەی (١-٩) دا دیارە:-




وێنەی (١-٩)

٣. لە پەنجەرەی (Properties) ئەم سیفاتانە جێبەجێ بکە:-

| ئامرازەکان | Properties | گۆڕانکاری |
| --- | --- | --- |
| Lable1 | caption | Input number1 |
| Lable2 | caption | Input number2 |
| Lable3 | Caption | Result |
| Command Button | Caption | Add |

٤. بۆ نوسینی(Code) ی کرداری کۆکردنەوە کە دوو جار لەسەر (Comand Button) کلیك دەکەین بەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

```
Private Sub Command1_Click()
Dim i As Integer
Dim j As Integer
Dim k As Integer
i = Val(Text1.Text)
j = Val(Text2.Text)
k = i + j
Text3.Text = k
End sub
```

٥. جێبەجێ کردنی پرۆگرامەکە بەهۆی (F5).

٦. دوای دانانی ژمارەکان لە (Text Box) دا، بۆ نموونە دانانی ژمارە (١٠) لە (Text1) و ژمارە (٢٠) لە (Text2) دوای دانانی ژمارەکان کلیك لەسەر (Add) بکە ئەنجامی کۆکردنەوەکە لە (Text3) دەردەچێت.

**تێبینی:-**

**١. بۆ کردارەکانی تری بیرکاری وەك ( کەم کردنەوە-دابەش کردن-جاران کردن) هەمان پرۆگرامی یەکەم دووبارە دەکەینەوە بەڵام لەجیاتی کۆکردنەوە(+) ئەوا یەك لەم کردارانە بەکاردێنین.**

**٢. بۆ ئەنجامدانی ئەم کردارە (K=j+l*l-j+l ) تەنیا لەشوێنی کرداری کۆکردنەوەکە دای‌دەنین.**

## پرۆگرامی دووەم:- لەسەر ئامرازی (Combo Box):-

ئەم پرۆگرامە بۆ دەست نیشان کردنی ناوی وڵاتێک لەئامرازی (Combo Box)و، دەرچوونی ناوی پایتەختەکەی لە (Text Box) دایە، بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی :
(ComboBox - TextBox - CommandButton)

هەنگاوەکانی کارکردن:-

١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).
٢. دوو ئامرازی (CommandButton) یەک ئامرازی (ComboBox) یەک ئامرازی (TextBox) زیاد دەکەین بۆ فۆرمەکە، وەک لە وێنەی(١-١٠) دا دیارە:-



وێنەی(١-١٠)

٣. لەپەنجەرەی (properties) ئەم سیفاتانە جێبەجێ دەکەین:-

| گۆڕانکاری | Properties | ئامرازەکان |
|---|---|---|
| Add to Combo | caption | Command Button1 |
| Add to Text | caption | Command Button2 |

٤. بۆ نوسینی (Code) دووجار کلیك لەسەر (Add to Combo) دەکەین بەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub command1-click()
combo1.additem "Iraq"
combo1.additem "Kurdstan"
combo1.additem "Germany"
End sub
```

٥. بۆ نوسینی (Code )دووجار کلیك لەسەر (Add to Text) دەکەین بەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub command2-click()
Dim I as integer
I=combo1.list index
Select case I
Case 0
Text1.text="Bagdad"
Case 1
Text1.text="Hawler"
Case 2
Text1.text="Barlen"
End select
End sub
```

٦.جێبەجێ کردنی پرۆگرام بەهۆی دوگمەی (F5) .

٧.دوای جێبەجێ کردنی پرۆگرام، بۆ دەرچونی ناوی ولاتەکان لەناو (Combo Box) کلیك لەسەر (Add to combo) دەکەین، پاشان بەهۆی سهمی (Combo Box) ناوی وڵاتێك هەڵدەبژێرین، ئینجا کلیك لەسەر (Add to text) دەکەین سەیری (Text1) بکە دەبینی ناوی پایتەختەکەی دەردەچێت.

## پرۆگرامی سێیەم :- لە سەر ئامرازی (Option Button):-

بە بەکارهێنانی ئەم ئامرازە دەتوانین تەنیا یەك کردار جێبەجێ بکەین و ناتوانین دوانیان بەیەکەوە ئەنجام بدەین. ئەم پرۆگرامەی خوارەوە بۆ کردارەکانی بیرکاری (+،-،/،*) دروست دەکەین، بە بەکارهێنانی ئەم ئامرازە لەگەڵ ئامرازەکانی تر.

هەنگاوەکانی کارکردن:-

١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).

٢. سێ ئامرازی (TextBox) و چوار ئامرازی (OptionButton) و یەك ئامرازی (CommandButton) زیاد دەکەین بۆ فۆرم، وەك لە وێنەی (١-١١) دا دیارە:-




وێنەی(١-١١)

٣. لە پەنجەرەی تایبەتی (Properties) ئەم سیفاتانە جێبەجێ دەکەین:-

| ئامرازەکان | Properties | گۆڕانکاری |
| --- | --- | --- |
| Option Button1 | Caption | Addition |
| Option Button2 | Caption | Subtriaction |
| Option Button3 | Caption | Division |
| Option Button4 | Caption | Multiplcation |
| Command Button1 | Caption | Result |

٤. بۆ نوسینی (Code) کە دووجار لەسەر (Result) کلیك بکە بەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

```
Private sub command1-click()
Dim I as integer
Dim j as integer
Dim k as integer
I=val(text1.text)
J=val(text2.text)
If option1.value= true then k=I+j
If option2.value= true then k=I-j
If option3.value= true then k=I/j
If option4.value= true then k=I*j
Text3.text=k
End sub
```

٥. پرۆگرامەکە جێبەجێ بکە بەهۆی دوگمەی (F5).

٦. ژمارەیەك بۆ هەریەك لە (Text1) و (Text2) دابنێ، ئینجا کلیك لەسەر (Result) بکە، بۆ دەرچوونی ئەنجامی دووژمارەکە لە (Text3) .

**پرۆگرامی چوارەم:- لەسەر ئامڕازی (Check Box):-**

**پرۆگرامێك بنوسە بۆ دۆزینەوەی (K)ەکە، دەکاتە:-**

K=x+y+z+n

**ئەگەربزانی (n=500,z=50,y=10,x=2)، جێبەجێ کردنی بەرنامەکە بەهۆی بەکارهێنانی (Check Box) ؟**

**هەنگاوەکانی کارکردن:-**

**١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).**

**٢. چوار ئامڕازی (CheckBox) و یەك (TextBox) و (Command Button) یێك زیاد دەکەین بۆ فۆرم، وەك لە وێنەی(١-١٢) دا دیارە:-**




وێنەی(١-١٢)

٣. لەپەنجەرەی تایبەتی دا ئەم سیفاتانە جێبەجێ دەکەین:-

| ئامرازەکان | Properties | گۆڕانکاری |
|---|---|---|
| Command button1 | Caption | Add |
| Check1 | Caption | X=2 |
| Check2 | Caption | Y=10 |
| Check3 | Caption | Z=50 |
| Check4 | Caption | N=500 |

٤. بۆ نوسینی (Code) کە دووجار لەسەر (Add) کلیك دەکەین بەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

```
Private sub command1- click()
Dim x as integer
Dim y as integer
Dim z as integer
Dim n as integer
Dim k as integer
 If check1.value=1 then x=2
If check2.value=1 then y=10
If check3.value=1 then z=50
If check4.value=1 then n=500
K=x+y+z+n
Text1.text=k
End sub
```

٥. پرۆگرامەکە جێبەجێ بکە بەهۆی دوگمەی (F5).

٦.دوای کلیك لەسەر چوارگۆشەی هەر چوار ئامرازەکانی (Check Box) بکە، ئینجا کلیك لەسەر (Add) بکە و سەیری (Text1) بکە، دەبینی ئەنجامی کۆکردنەوەکە دەردەچێت.

**پرۆگرامی پێنجەم:-بەکارهێنانی هەردوو ئامرازی**
(Horizontal Scrool bar) و (Virtical Scroll bar) .

بەهۆی بەکارهێنانی ئەم ئامرازانەوە دەتوانین ئامرازی (Lable) بگوازینەوە لەسەرەوە بۆ خوارەو، یان لەڕاستەوە بۆ چەپ.

**هەنگاوەکانی کارکردن:-**

١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).

٢.هەریەك لە ئامرازی (Horizontal Scrool bar) و (Virtical Scroll bar) و (Lable) یەك زیاد دەکەین بۆ فۆرم، وەك لە وێنەی (١-١٣) دا دیارە:-




وێنەی(١-١٣)

٣. لەپەنجەرەی تایبەتی (Properties) دا ئەم گۆڕانكاریانە ئەنجام بدە:-

| ئامرازەكان | Properties | گۆڕانكاری |
|---|---|---|
| Lable1 | Caption | Test |
| Horizontal Scrool bar | Name | Hs1 |
| Horizontal Scrool bar | Small change | 50 |
| Horizontal Scrool bar | Large change | 200 |
| Horizontal Scrool bar | Min | 200 |
| Horizontal Scrool bar | max | 2000 |
| Virtical Scroll bar | Name | Vs1 |
| Virtical Scroll bar | Small change | 50 |
| Virtical Scroll bar | Large change | 200 |
| Virtical Scroll bar | Min | 200 |
| Virtical Scroll bar | max | 2000 |

٤. بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەر (Horizontal Scrool bar) كلیك دەكەین بە شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub hs1-change()
Dim x as integer
Dim x1 as integer
X1=Lable1.Left
X=hs1.value
Lable1.Left=x+x1
End sub
```

٥. بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەر (Virtical Scroll bar) کلیك دەکەین بەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub vs1-change()
Dim y as integer
Dim y1 as integer
Y1=Lable1.top
Y=vs1.value
Lable1.top=y+y1
End sub
```

٦. پرۆگرامەکە جێبەجێ بکە بەهۆی دوگمەی (F5 ).

## پرۆگرامی شەشەم:- بەکارهێنانی ئامرازەکانی (Directory,Files,Drives,Picture Box):-

ئەم پرۆگرامە بەمەبەستی پیشاندانی ئەو وێنانەی کە لە ناو فۆلدەرەکاندا هەیە لە (PictureBox) پیشان بدرێت.

هەنگاوەکانی کارکردن:-

١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).

٢.هەریەك لەئامرازەکانی (Directory,Files,Drives,Picture Box, Text Box, Command Button) بۆ فۆرم زیاد دەکەین، وەك لە وێنە (١-١٤) دا دیارە:-




وێنەی(١-١٤)

٣. بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەر (Files) کلیك دەکەین بەم شێوەی خوارەوە:-

```
private sub files1-change()
Text1.text=file1.file name
End sub
```

٤. بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەر (Directory) کلیك دەکەین بەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub dir1-change()
File1.path=dir1.path
File1.pattern= *.*
End sub
```

٥. بۆ نوسین (Code) دووجار لەسەر (Drive1) کلیك دەکەین بەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub drive1-change()
Dir1.path=drive1.drive
End sub
```

٦.دووجار لەسەر (Command Button) کلیك دەکەین بۆ نوسینی (Code) بەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub command1-click()
Picture1.picture=Loadpicture(dir1.path & "\" & File1. Filename)
End sub
```

٧. پرۆگرامەکە جێبەجێ بکە بەهۆی دوگمەی (F5) .

## پرۆگرامی حەوتەم:-لەسەر ئامرازی کۆنترۆلی (CommandButton)

لەم پرۆگرامەدا سێ ئامرازی کۆنترۆلی (CommandButton) بەکاردێنین، کەکاتێك کلیك لەسەر هەریەك لە ئامرازەکان بکەین ڕەنگی (Form)ەکەمان دەگۆڕێت بەگوێرەی هەڵبژاردنی ڕەنگی پێویست؟

هەنگاوەکانی کارکردن:-

١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).

٢. بۆ (Form) سێ ئامرازی کۆنترۆلی (CommandButton) زیاددەکەین.

٣. لەپەنجەرەی تایبەتی (Properties) دا ئەم گۆڕانکاریانە ئەنجام بدە:-

| گۆڕانکاری | Properties | ئامرازەکان |
| --- | --- | --- |
| Green | Caption | CommandButton1 |
| Red | Caption | CommandButton2 |
| Blue | Caption | CommandButton3 |

دوای جێبەجێ کردنی گۆڕانکاریەکان، سەیری وێنەی(١-١٥)بکە:-




وێنەی(١-١٥)

٤.بـۆ نوسـینی (Code) دووجـار لەسـەر یـەك كلیـك لەسـەر (Green) دەكەین، كەبەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

```
Private sub Command1-Click()
Form1.BackColor=VbGreen
Endsub
```

٥.بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەر یەك كلیك لەسـەر (Red) دەكـەین، كەبەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

```
Private sub Command2-Click()
Form1.BackColor=VbRed
Endsub
```

٦.بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەر یەك كلیك لەسەر (Blue) دەكـەین، كەبەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

```
Private sub Command3-Click()
Form1.BackColor=VbBlue
Endsub
```

٧. پرۆگرامەكە جێبەجێ بكە بەهۆی دوگمەی (F5) .

٨.ئینجا كلیك لەسـەر هەریـەك لـەئامرازەكان بكـە و سـەیركە چۆن ڕەنگـی (Form)ەكە دەگۆڕێت.

## پرۆگرامی هەشتەم:- لەسەر ئامرازی (ListBox)

لەم پرۆگرامەدا باسی زیادکردنی ناوی کەسێك لەگەڵ تەمەن و ئەو شارەی کەلێی دەژی بۆ (ListBox) دەکەین، بەهۆی بەکارهێنانی ئامرازەکانی (TextBox) لەگەڵ (CommandButton) بەرەچاوکردنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە؟

هەنگاوەکانی کارکردن:-

١.بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (NewProject).

٢.سێ ئامرازی (ListBox) سێ ئامرازی (TextBox)و دوو ئامرازی (CommandButton)و هەروەها شەش ئامرازی (Label)یش زیاد دەکەین بۆ (Form). وەك لەوێنەی(١-١٦) دادیارە:-

Form1

Label1 Text1
Label2 Text2
Label3 Text3
Label4 Label5 Label6
List1 List2 List3
Command1 Command2

وێنەی(١-١٦)

٣. لەپەنجەرەی تایبەتی (Properties) دا ئەم گۆڕانکاریانە ئەنجام بدە:-

| گۆڕانکاری | Properties | ئامرازەکان |
|---|---|---|
| AddtoListBox | Caption | CommandButton1 |
| DeleteText | Caption | CommandButton2 |
| Name | Caption | Label1 |
| Age | Caption | Label2 |
| City | Caption | Label3 |
| Name | Caption | Label4 |
| Age | Caption | Label5 |
| City | Caption | Label6 |

٤.دوای ئەنجام دانی گۆڕانکاریەکان سەیری وێنەی(١-١٦) بکە چۆن ئەم گۆڕانکاریانەی بەسەر دێت، وەك لەوێنەی(١-١٧) دا دیارە:-

وێنەی(١-١٧)

٥.بۆ نوسینی (Code) دوو جار لەسەر یەك كلیك لەسەر (AddtoListBox) دەكەین، كەبەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

```
Private sub Command1-Click()
Dim Name as string
Dim Age as iteger
Dim City as string
Name=Text1.text
Age=Val(Text2.text)
City=Text3.text
List1.Additem Name
List2.Additem Age
List3.Additem City
End sub
```

٦.بۆ نوسینی (Code) دوو جار لەسەر یەك كلیك لەسەر (DeleteText) دەكەین، كەبەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

```
Private sub Command2-Click()
Text1.text=" "
Text2.text=" "
Text3.text=" "
Endsub
```

٧.جێبەجێ كردنی پرۆگرام بە هۆی دوگمەی (F5) .

## بارەكانی ماوس (Mouse Event)

سیستەمی (ڤیژوەل بیسك) وا گونجاوە كە دەتوانین زۆر كرداری جیاواز جێبەجێ بكەین. ئەو كردارانەش لە سیستەمی (ڤیژوەل بیسك) لە ڕێگای بارەكانی (Event) وە ئەنجام دەدرێ، لێرەش بەكورتی باسی هەندێك لەبارەكان دەكەین:-

١. Click .
٢. Double Click .
٣. Mouse Move.
٤. Drag Drop .
٥. Mouse Down .
٦. Mouse Up .

### ١-باری (Click):-

بریتی‌یه له باری یه‌ك كلیك به‌هۆی دوگمه‌ی (ماوس) له‌سه‌ر ئامرازه‌كانی كۆنترۆل.

پرۆگرام:-

ئێستا به‌رنامه‌یه‌كی نوێ ده‌كه‌ینه‌وه بۆ به‌كارهێنانی باری كلیك له‌سه‌ر ئامرازی ناونیشان (Lable) كاتێك كلیك له‌سه‌ر ئه‌م ئامرازه ده‌كه‌ین، بۆ بچووك كردنه‌وه‌ی ئه‌و (Font) ه كه‌له‌ناو (Lable) ه‌كه ده‌نوسین، بۆ جێبه‌جێ كردنی ئه‌م پرۆگرامه ئه‌م هه‌نگاوانه‌ی خواره‌وه ده‌هاوێژین؟

هه‌نگاوه‌كانی كاركردن:-

١. به‌رنامه‌یه‌كی نوێ ده‌كه‌ینه‌وه (New Project).

٢.ئامرازی ناونیشان (Lable) زیاد ده‌كه‌ین بۆ (Form)، وه‌ك له‌وێنه‌ی(٢-١)دا دیاره:-




وێنه‌ی(٢-١)

٣.لەپەنجەرەی تایبەتی (Properties) ئەم سیفاتانە لەسەر (Lable) جێبەجێ دەکەین:-

| ئامرازەکان | Properties | گۆڕانکاری |
|---|---|---|
| Lable1 | Name | Lblclick |
| Lable1 | Caption | Smaller |
| Lable1 | Font size | 24 |

٤. بۆ نوسینی (Code)ی پرۆگرام دووجار لەسەر یەك لەسەر ئامرازی (Lable1) کلیك دەکەین ، بەم شێوەی خوارەوە دەبێت:-

```
Private sub Lblclick-click()
Lblclick.fontsize=Lblclick.fontsize-2
Endsub
```

٥. پرۆگرامەکە جێبەجێ بکە بەهۆی دوگمەی (F5) .

٦.دوای جێبەجێ کردنی کلیك لەسەر (Smaller) بکە سەیری نوسینەکە بکە چۆن بچووك دەبێتەوە.

## ٢-باری (Double Click):-

بریتی‌یە لە دووجار لەسەریەك كلیك كردن لەسەر ئەو ئامرازەی كە بەكاردێت.

پرۆگرام:-

ئێستا بەرنامەیەكی نوێ دەكەینەوە بۆ بەكارهێنانی باری (doubleclick) لەسەر ئامرازی ناونیشان (Lable) كاتێك كلیك لەسەر ئەم ئامرازە دەكەین، بۆ گەورە كردنی ئەو (Font) ە كەلەناو (Lable) ەكە دەنوسین، بۆ جێبەجێ كردنی ئەم پرۆگرامە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەهاوێژین؟

هەنگاوەكانی كاركردن:-

١. بەرنامەیەكی نوێ دەكەینەوە (New Project).

٢.ئامرازی ناونیشان (Lable1) زیاد دەكەین بۆ (Form)، وەك لەوێنەی(٢-٢) دا دیارە:-




وێنەی(٢-٢)

٣. لەپەنجەرەی تایبەتی(Properties) ئەم سیفاتانە جێبەجێ دەكەین لەسەر ئامرازی(Lable1) :-

| گۆڕانكاری | Properties | ئامرازەكان |
|---|---|---|
| Lbldclick | Name | Lable1 |
| Larger | Caption | Lable1 |
| 8 | Fontsize | Lable1 |

٤. بۆ نوسینی (Code)ی پرۆگرام دووجار لەسەر یەك لەسەر ئامرازی (Lable1) كلیك دەكەین ئینجا لەخانەی بارەكانیش (doubleclick) هەڵبژێرە، كۆدەكەش بەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub LblDclick-DblClick ()
LblDclick.fontsize=LblDclick.fontsize+2
Endsub
```

٥. پرۆگرامەكە جێبەجێ بكە بەهۆی دوگمەی (F5) .

٦.دوای جێبەجێ كردنی كلیك لەسەر (Larger) بكە، سەیری نوسینەكە بكە چۆن گەورە دەبێت.

## ٣-باری (Mouse Move) :-

بریتی‌یە لە جولاندنی نیشاندەری (ماوس) لەسەر ئامڕازی بەکارهاتوو بۆ رودانی بارەکە.

شێوەی گشتی بۆ ئەم بارە بریتی‌یە لە:-

```
Private Sub Control name_MouseMove(Button As
 Integer, Shift As Integer, X As Single, Y As Single)
```

بەم جۆرە:-

Control name :-ناوی ئەو ئامڕازەی کە بەکاردێت.

Mouse Move:- باری جولاندنی نیشاندەری (ماوس).

Button :- بریتی‌یە لە ژمارەی ڕاستی (Integer) نمونەی ژمارەی دوگمەکانی (ماوس)، کە کلیك دەکەین. خشتەی خوارەوەش ژمارەی دوگمەکانی (ماوس) دیاری دەکات:-

| | |
|---|---|
| 1 | Left |
| 2 | Right |
| 3 | Left and Right |
| 4 | Middle |
| 5 | Left and Middle |
| 6 | Right and Middle |
| 7 | All |

Shift:- بریتی‌یە لە ژمارەی ڕاستیەکان، کاتێك کلیکی ( Shift) یان (Alt) دابگرین لەکاتی کلیك کردن.

خشتەی خوارەوەش ژمارەکانی ئەم کلیلەیە:-

| | |
|---|---|
| 1 | Shift |
| 2 | Ctrl |
| 3 | Alt |
| 4 | Shift and Ctrl |
| 5 | Shift and Alt |
| 6 | Ctrl and Alt |
| 7 | Shift and Ctrl and Alt |

X :- نمونەی شوێنی نیشاندەری (ماوس)ە بەشێوەی ئاسۆیی واتە (تەوەرەی سینی).

Y:- نمونەی شوێنی نیشاندەری (ماوس)ە بەشێوەی ستونی واتە (تەوەرەی‌صادی).

پرۆگرام:-

لەم پرۆگرامەی خوارەوە بەشێوەیەکی گونجاو باس لەم بارە دەکات بۆ گواستنەوەی نیشاندەری (ماوس) لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ؟

**هەنگاوەکانی کارکردن:-**

**١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).**

**٢.ئامرازی ناونیشان (Lable1) و ئامرازی سندوقی وێنە (Picture Box) زیاد دەکەین بۆ (Form)، وەك لەوێنەی (٢-٣) دا دیارە:-**




وێنەی(٢-٣)

**٣.ئەم سیفاتانە (Properties) جێبەجێ دەکەین لەسەر (Lable1) :-**

| ئامرازەکان | Properties | گۆڕانکاری |
|---|---|---|
| Lable1 | Name | LblMove |
| Lable1 | Caption | ڕەشی دەکەینەوە بە هۆی (Delete) ی دوگمەی کیبۆرد. |

٤. بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەریەك لەسەر سندوقی وێنە (Piture Box) كلیك دەكەین و لەخانەی بارەكان دا (Mouse Move) هەڵبژێرە (Code) ەكەش بەم شێوەی خوارەوە بنوسە:-

| Picture1 | ▼ | Mouse Move(خانەی بارەكان) | ▼ |
|---|---|---|---|

```
Private sub picture1-Mouse Move(boutton as
integer,shift as integer,x as single,y as single)
Dim xstr as string
Dim ystr as string
Xstr=cstr(x)
Ystr=cstr(y)
 LblMove.Caption="x:" & xstr & "," & "y:" & ystr
End sub
```

٥.جێبەجێ كردنی پرۆگرام بە داگرتنی دوگمەی (F5) .

٦.بەجولاندنی نیشاندەری (ماوس) لەسەر (Picture Box) سەیری (Lable1) بكە چۆن گۆڕانكاری لەژمارەكاندا ڕودەدات.

## ٤- باری (Drag and Drop) :-

ئەم بارە بریتی‌یە لەگواستنەوەی ئامرازی کۆنترۆل لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەسەر هەمان (Form).

شێوەی گشتی ئەم بارە بریتی‌یە:-

```
Private sub Form-Drag Drop(source as control,x as
single,y as single)
```

Source :- بریتی‌یە لە ئامرازەکانی کۆنترۆلی بەکارهاتوو .

پرۆگرام:-

باسی چۆنیەتی گواستنەوەی ئامرازی وێنە (Picture box) لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەسەر هەمان (Form) دەکەین؟

هەنگاوەکانی کارکردن:-

١. بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).

٢.ئامرازی وێنە (Picture box) زیاد دەکەین بۆ (Form)، وەك لەوێنەی (٢-٤) دا دیارە:-




وێنەی(٣-٤)

٣.ئەم سیفاتانە (Properties) جێبەجێ دەكەین:-

| ئامرازەكان | Properties | گۆڕانكاری |
|---|---|---|
| Picture box | DragMode | 1-Automatic |
| Picture box | Back color | Highlight |

٤. بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەریەك لەسەر سندوقی وێنە (Piture Box) كلیك دەكەین و لەخانەی بارەكان دا (Mouse Down) هەلبژێرە (Code) ەكەش بەم شێوەی خوارەوە بنوسە:-

```
Private sub picture1-Mouse Down(Button as integer,shift
as integer,x as single,y as single)
Picture1.Drag
End sub
```

٥. بۆ نوسینی (Code) دووجار لەسەریەك لەسەر (Form) كلیك دەكەین و لەخانەی بارەكان دا (DragDrop) هەلبژێرە (Code) ەكەش بەم شێوەی خوارەوە بنوسە:-

```
Private sub Form-Drag Drop(source as control,x as
single,y as single)
Source.move x,y
End sud
```

٦.جێبەجێ كردنی پرۆگرام بەهۆی دوگمەی (F5) .

٧. بەڕاكێشانی (Picture box) و گواستنەوەی بۆ شوێنێكی تر بە بەردەوامی كلیكی (ماوس) شێوەیەكی هاوشێوەی خۆی دەردەچێت.

## ٥- باری (Mouse Down/ Mouse Up) :-

کرداری داگرتنی دوگمەی (ماوس) (Mouse Down) بە داگرتنی دوگمەی (ماوس) لەسەریەك، و دوای دەست هەلگرتن لەسەر دوگمەی (ماوس) (Mouse Up) .

شێوەی گشتی بۆ باری (Mouse Down) بریتییە:-

Private sub Control name-Mouse Down(Button as integer,shift as integer,x as single,y as single)

بەلاّم شێوەی گشتی بۆ (Mouse Up) بریتییە لە:-

Private sub Control name-Mouse Up(Button as integer,shift as integer,x as single,y as single)

بەم جۆرە:-

Control name :- ناوی ئامرازی کۆنترۆلی بەکارهاتووە.

Mouse Down:- باری داگرتن لەسەر (ماوس).

Mouse Up:- روداوی دەست هەلگرتن لەسەر دوگمەی (ماوس).

Button :- بریتییە لە ژمارەی ڕاستی (Integer) نمونەی ژمارەی دوگمەکانی (ماوس)، کە کلیك دەکەین. و خشتەی خوارەوەش ژمارەی دوگمەکانی (ماوس) دیاری دەکات:-

| | |
|---|---|
| Left | 1 |
| Right | 2 |
| Left and Right | 3 |
| Middle | 4 |
| Left and Middle | 5 |
| Right and Middle | 6 |
| All | 7 |

Shift:- بریتی‌یە لە ژمارەی ڕاستیەکان کاتێك کلیکی (Shift) یان (Alt) دابگرین لەکاتی کلیك کردن. خشتەی خوارەوەش ژمارەکانی ئەم کلیلەیە:-

| | |
|---|---|
| Shift | 1 |
| Ctrl | 2 |
| Alt | 3 |
| Shift and Ctrl | 4 |
| Shift and Alt | 5 |
| Ctrl and Alt | 6 |
| Shift and Ctrl and Alt | 7 |

X :- نمونەی شوێنی نیشاندەری (ماوس)ە بەشێوەی ئاسۆیی واتە (تەوەرەی سینی).

Y:- نمونەی شوێنی نیشاندەری (ماوس)ە بەشێوەی ستونی واتە (تەوەرەی صادی).

پرۆگرام:-

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بارە دوو ئامرازی ناونیشان (Lable1,Lable2) بەکاربێنە ؟

**هەنگاوەکانی کارکردن:-**

**بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project).**

**٢.دوو ئـامرازی ناونیشـان (Lable1) و (Lable2) زیـاد دەکـەین بـۆ (Form)، وەك لەوێنەی(٢-٥) دا دیارە:-**




**وێنەی(٢-٥)**

**٣.ئەم سیفاتانە (Properties) لەسەر هەردوو (Lable) ەکان جێبەجێ دەکەین:-**

| ئامرازەکان | Properties | گۆڕانکاری |
|---|---|---|
| Lable1 | Name | LblMessade |
| Lable1 | Appearance | 0-flat |
| Lable1 | Caption | Click Here |
| Lable1 | Fonsize | 12 |
| Lable1 | Font style | Bold |
| Lable2 | Name | LblMouse |
| Lable2 | Auto size | True |
| Lable2 | Font size | 14 |
| Lable2 | Font style | Bold |

٤. بۆ نوسـينى (Code) دووجـار لەسـەر يـەك كليـك لەسـەر ئـامڕازى (Lable1) دەكەين ئنجا لە خانەى بارەكان دا (Mouse Down) هەڵبژێرە (Code) ى بەم شێوەى خوارەوە:-

```
Private sub Lable1-Mouse Down(Button as integer,shift
as integer,x as single,y as single)
LblMouse.caption="MouseDown"
Endsub
```

٥. بۆ نوسـينى (Code) دووجـار لەسـەر يـەك كليـك لەسـەر ئـامڕازى (Lable1) دەكەين ئنجا لـە خانـەى بارەكـان دا (Mouse Up) هـەڵبژێرە (Code) ى بەم شێوەى خوارەوە:-

```
Private sub Lable1-Mouse Up(Button as integer,shift as
integer,x as single,y as single)
LblMouse.caption="MouseUp"
Endsub
```

٦.جێبەجێ كردنى پرۆگرام بەهۆى دوگمەى (F5) .

## لیستەکان ( Menus )

ئامانج لەزمانی (ڤیژوەل بیسک) ئاسانکاری بۆ پرۆگرامەر دەکات بە گوێرەی پێویست. ئەم ئامانجەش بەڕێگایەکی ئاسان دێتە ئەنجام بۆ دروست کردنی لیستەکان، لیستەکانیش کار ئاسانی بۆ بەکارهێنەر دەکات بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کردارانەی کە لە (ڤیژوەل بیسک) دەکەین. نمونەش بۆ لیستەکان ئەوا بەشێوەی بەردەوام لەبەر چاومانن وەك (File,Edit View,Insert) ..هتد.

## چۆنیەتی دروست کردنی لیستەکان ( Creating Menus ) :-

لەم بەشە باسی چۆنیەتی دروست کردنی لیستەکان و ئەو تایبەتمەندیانە دەکەین، کە پەیوەستن پێیەوە. هەروەها چۆنیەتی نوسینی (Code) بۆ دروست کردنی کردارەکان. لەم پرۆگرمەی خوارەوەدا باسی چۆنیەتی دروست کردنی دوو لیست دەکەین. لیستی یەکەم: بۆ دروست کردنی هێلێکی ڕاست (Line) و بازنەیەك (Circle) لیستی سەرەکی بەناوی (Draw). لیستی دووەمیش: بۆ دەرچوون لەپرۆگرام بەناوی (Exit)، کەوا بەم شێوەی خوارەوە دەبێت:-

**هەنگاوەكانی كاركردن:-**

**١.بەرنامەیەكی نوێ دەكەینەوە (New Project).**

**٢.كلیك لەسەر لیستی (Tools) دەكەین، پەنجەرەیەك دەكرێتەوە (Menu Editor) هەڵبژێرە، وەك لەوێنەی (٣-١) دا دیارە:-**




وێنەی(٣-١)

دوای هـەڵبژاردنی (MenuEditor) ئـەم پەنجەرەیـە دەبێتـەوە. وەك لەوێنەی (٣-٢) دا دیارە:-




وێنەی(٣-٢)

٣. لـە پەنجـەرەی (Menu Editor) دا لەخانەی بەرامبەر (Caption) وشـەی (Draw) بنوسـە، و لەبەرامبـەر خانـەی (Name) یشـدا (MenuDraw) بنوسـە. بـەڵام بـۆ درسـت کردنـی لیسـتی (Line) و (Circle)، کە بەشێك بن لەلیستی (Draw) کلیك لەسەر دوگمەی (Next) بکە. دوای کلیك لەسەر ئەم نیشانەیە(→) بکە، ئینجا لەخانەی بەرامبەر (Caption) وشەی (Line) بنوسە، بەرامبەر خانەی (Name) یش وشەی (Draw Line) بنوسە.

٤.جارێکی تر کلیک لەسەر (Next) دەکەین دوای کلیک لەسەر ئەم نیشانەیە (→)، ئینجا لەخانەی بەرامبەر (Caption) وشەی (Circle) بنوسە. بەرامبەر خانەی (Name) یش وشەی (DrawCircle) بنوسە.

٥.کلیك لەسەر دوگمەی (Ok) بکە، فۆرمەکەمان بەم شێوەی خوارەوە دەبێت. وەك لە وێنەی (٣-٣) دا دیارە:-




وێنەی(٣-٣)

٦.بۆ نوسینی (Code) کلیك لەسەر (Draw) بکە. ئینجا (Double Click) لەسەر (Line) بکە بۆ کردنەوەی پەنجەرەی (Code)، کە بەم شێوەی خوارەوە دەنوسرێت:-

```
Private sub DrawLine-click()
Line(750,750)-(2500,1500),vbred
Endsub
```

٧.بـــۆ نوســـینی (Code) کلیــك لەســـەر (Draw) بکـــە ئینجـــا (Double Click) لەسەر (Circle) بکە بۆ کردنـەوەی پەنجـەرەی (Code) کە بەم شێوەی خوارەوە دەنوسرێت:-

```
Private sub DrawCircle-click()
Circle(2500,500),500,vbgreen
Endsub
```

لیستی یەکەم تەواو بوو.

باسی چۆنیەتی دروست کردنی لیستی دووەم دەکەین:-

هەنگاوەکانی کارکردن:-

١. هــەر لەهــەمان فـۆرم کلیـك لەســـەر لیســتی (Tools) دەکــەیت و (Menu Editor) هەڵبژێرە.

٢. لەپەنجەرەی (Menu Editor) دا، لەبەشـی خـوارەوەی کلیك لەسـەر (Circle) بکـە، ئینجا کلیـك لەسـەر دوگمـەی (Next) بکــە، دوای کلیـك لەسەر ئەم نیشانەیە (←) بکە .

٣. لەخانـەی بەرامبـە (Caption) وشــەی (Exit) بنوســە، لەبەرامبـەر خانەی (Name) یش وشەی (MenuExit) بنوسە.

٤. دوای کلیك لەسـەر (Next) بکە ئینجا کلیك لەســەر ئـەم نیشـانەیە (→) بکـە، بـۆ ئـەوەی لیســتی (Close) لـەناو لیســتی (Exit) دروســت بکەین.

٥. لەخانـەی بەرامبـەر (Caption) وشـەی (Close) بنوسـە لەخانـەی بەرامبـەر (Name) یـش وشــەی (MenuClose) بنوســە، ئینجـا کلیـك لەسەر دوگمەی (Ok) بکە.

٦.بۆ نوسینی ( Code)کلیک لەسەر (Exit)بکە، ئینجا Double (Click) لەسەر دوگمەی (Close) بکە، بۆ نوسینی (Code) کەبەم شێوەی خوارەوە دەبێت:-

```
Private sub MenuClose-Click()
End
End sub
```

٧.بۆ جێبەجێ کردنی پرۆگرام بەهۆی دوگمەی (F5) .

٨.ئینجا کلیک لەسەر (Line) و (Circle) بکە، ئەم شێوەی خوارەوەمان بۆ دەردەچێت. وەك لە وێنەی (٣-٤) دا دیارە:-




وێنەی(٣-٤)

## کارکردن لەگەڵ لیستەکان بەهۆی بەکارهێنانی کیبۆردەوە:-

لەم بەشەدا بەکورتی باسی چۆنیەتی دروست کردنی لیستێکی ئاسانمان کرد، بەڵام لەم باسەماندا باسی چۆنیەتی کارکردن لەگەڵ کیبۆرد بۆ جێبەجێ کردنی پرۆگرامەکەمان دەکەین، ئەم کارەش ئاسانە لەسیستەمی (ڤیژوەل بیسك) دا، بۆ کردنەوەی لیستی (Draw) یان (Exit) بەهۆی کیبۆردەوە رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکە:-

١. کلیك لەسەر (Tools) بکەو پەنجەرەی (Menu Editor) هەڵبژێرە.

٢. دانانی ئەم نیشانەیە (&) لەپێش وشەی (Draw) لەخانەی (Caption)، وەك لەوێنەی (٣-٥) دا دیارە:-




وێنەی(٣-٥)

٣.كلیك لەسەر دوگمەی (Ok) بكە.

٤.سەیركە دەبینی هێڵێكی بچووك لەژێر پیتی(D) لەوشەی (Draw) دەردەچێت. وەك لەوێنەی (٣-٦) دا دیارە:-




وێنەی(٣-٦)

٥.پرۆگرامەكە جێبەجێ بكە بەهۆی دوگمەی (F5 ) .

٦.دوای جێبەجێ كردن دەستت دانێ سەر پیتی (Alt+D) لەكیبۆرد، دەبینی چۆن لیستی (Draw) دەبێتەوە. لێرەدا ناتوانین لیستی (Exit) بەهۆی كیبۆرد بكەینەوە؟ چونكە ئەم نیشانەمان (&) لەپێش وشەی (Exit) دانەناوە. ئەگەر ویستمان ئەمەشیان بەهۆی كیبۆرد بكرێتەوە، ئەوا نیشانەی (&) لەپێش وشەی (Exit) دابنێ و هەمان هەنگاوەكانی پێشوو دووبارەبكەوە.

## چۆنیەتی دروست کردنی داتابێز:-

زۆر رێگا هەیە بۆ دروست کردنی داتابێز، دەتوانین پرۆگرامی مایکرۆسۆفت ئەکسس (MicroSoftAccess) بەکاربێنین. بەلام بەهۆی پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسك) دەتوانین، رێگایەکی تر بەکاربێنین بۆ دروست کردنی داتابێز بەهۆی بەرنامەی (VisData)، کە لەناو پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسك) دا هەیە، ئێستا باسی دروست کردنی داتابێزێکی ئاسان دەکەین، کە پێکهاتووە لە دوو ستون، وەك لە خشتەی خوارەوەدا دیارە:-

| ستونەکان | جۆرەکەی |
| --- | --- |
| StName | Text |
| StAge | Integer |

بۆ دروست کردنی داتابێزەکە بەرنامەی (VisData) بەکاردێنین و، ناوی دەنێنین (StudentDB). بۆ دروست کردنی داتابێزەکە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەهاوێژین:-

١.بەرنامەیەکی نوێ دەکەینەوە (New Project)..

٢.لەلیستی سەرەکی روکاری پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسك) دا کلیك لەسەر (Add-Ins) بکە و، لیستێك دەکرێتەوە. لەو لیستەدا (VisualDataManager) هەڵبژێرە، وەك لە وێنەی(٤-١) دا دیارە:-




وێنەی(٤-١)

٢.دوای هەڵبژاردنی (Visual Data Manager) ،روکاری بەرنامەی (VisData) دەکرێتەوە، وەك لەوێنەی(٤-٢) دا دیارە:-




وێنەی(٤-٢)

٤.كليك لەسەر ليستی (File) بكە، ئينجا كليك لەسەر (New) بكە و، ئينجا كليك لەسەر (MicroSoftAccess) بكە، ئينجا (Version7.0MDB) هەلبژێرە. وەك لەوێنەی(٤-٣) دادیارە:-




وێنەی(٤-٣)

٥. لەو روکارەی کەدەکرێتەوە، ناوی داتابێزەکە (studentDB) لەخانەی بەرامبەر (FileName) دابنێ، کە لەوێنەی(٤-٤) دا دیارە. بۆ (خزن) کردنی داتابێزەکە کلیك لەسەر (Save) بکە .




وێنەی(٤-٤)

٦.دوای (Save) کـردن، ئـەم روکـارەی خـوارەوە دەکرێتـەوە. وەك لەوێنەی(٤-٥) دا دیارە:-




وێنەی(٤-٥)

٧.بەڵام بۆ دروست کردنی (جدول)ەکە بەناوی (AgeTable) ، رایت کلیـك (RightClick) لەسـەر (Properties) بکـە،ئینجـا (NewTable) هەڵبژێرە. وەك لەوێنەی(٤-٦) دا دیارە:-




وێنەی(٤-٦)

٨. .روكارى (NewTable) دەكرێتەوە، ئینجا لەخانەی بەرامبـەر (TableName) دا نـــاوى (جـــدول)ەكـــە(AgeTable) بنوســـــە، وەك لەوێنەی(٤-٧) دا دیارە:-

Table Structure

Table Name: AgeTable

Field List:

Name:

Type:

Size:

CollatingOrder:

AllowZeroLength

OrdinalPosition:

Required

ValidationText:

ValidationRule:

DefaultValue:

Add Field

Remove Field

Index List:

Name:

Fields:

Add Index

Remove Index

Close

وێنەی(٤-٧)

٩.دوای نوسینی ناوی (جدول)ەکە کلیك لەسەر (AddFiled) بکە،ئەم روکارەی خوارەوە دەکرێتەوەو، وەك لەوێنەی(٤-٨) دا دیارە. ئینجا لەخانەی بەرامبەر(Name) دا (StName) بنوسەو، بۆ درێژی ستونەکە لەخانەی(Size) یشدا ژمارە (٣٠) بنوسە ،و لەخانەی (Type) یشدا (Text) هەڵبژێرە. ئینجا کلیك لەسەر (ok) بکە.

Add Field
Name:
St Name
Type:
Text
Size:
30
FixedField
VariableField
AllowZeroLength
Required
OrdinalPosition:
ValidationText:
ValidationRule:
DefaultValue:
OK
Close

وێنەی(٤-٨)

١٠.بۆ زیاد کردنــی ســتونی دووەم لەخانــەی بەرامبــەر (Name) دا (StAge) بنوســـە. لەخانـــەی (Type) یشـــدا (Byte) هــەڵبژێرە،وەك لەوێنەی(٤-٩) دا دیارە:-

Add Field

Name:

StAge

Type:

Byte

Size:

OrdinalPosition:

ValidationText:

ValidationRule:

DefaultValue:

OK

Close

Required

وێنەی(٤-٩)

**کلیك لەسەر (Ok) بکە، ئینجا کلیك لەسەر (Close) بکە، بۆ گەڕانەوە بۆ ڕوکاری (NewTable)، وەك لەوێنەی (٤-١٠) دا دیارە:-**

Table Structure

Table Name: AgeTable

Field List:
StName
StAge

Name:
Type:
Size:
CollatingOrder:
AllowZeroLength
OrdinalPosition:
Required
ValidationText:
ValidationRule:
DefaultValue:

Add Field | Remove Field

Index List:
Name:
Fields:

Add Index | Remove Index

Build the Table | Close

وێنەی(٤-١٠)

١١. بۆ گەڕانەوە بۆ روکاری (DataBaseWindow) کلیك لەسەر (Build the Table) بکە، وەك لەوێنەی(٤-١١) دا دیارە:-




وێنەی(٤-١١)

بەم جۆرە (جدول)ی (AgeTable) مان تەواو کرد.

**چۆنیەتی دانانی زانیاریەکان بۆ ( جدول )ەکە :-**

**ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەهاوێژین:-**

**١. لـەروکاری (DataBaseWindow) دا، رایــت کلیــك (RightClick) لەسـەر (AgeTable) بکـە، لیسـتێك دەکرێتـەوە لــەو لیسـتـەدا (Open) هەڵبژێرە. وەك لەوێنەی(٤-١٢) دا دیارە:-**




وێنەی(٤-١٢)

٢.دوای کلیك کردن لەسەر (Open)، ئەم روکارەی خوارەوە دەبێتەوە، جا کلیك لەسەر (add) بکە. وەك لەوێنەی (٤-١٣) دا دیارە:-

Dynaset:AgeTable

Add | Edit | Delete | Close

Sort | Filter | Move | Find

Field Name: Value (F4=Zoom)

StName:

StAge:

(EOF)/0

وێنەی(٤-١٣)

٣.دوای ئەوەی کلیکت لەسەر (Add) کرد،ئەم روکارەی خوارەوە دەبێتەوە،وەك لەوێنەی (٤-١٤) دا دیارە. لەخانەی بەرامبەر (StName) دا ناوی (Erwany) بنوسە. ئینجا لەخانەی بەرامبەر (StAge) یشدا تەمەنی (١٨)ساڵ بنوسە. جا بۆ دلنیا بوون لەدانانی زانیاریەکان بۆ (جدول)ەکە کلیك لەسەر (UpDate) بکە.

Dynaset:AgeTable

Update | Cancel

Field Name: Value (F4=Zoom)

StName: Erwany

StAge: 18

Add record

وێنەی(٤-١٤)

٤.بۆ دانانی ناوێکیتر بە ناوی (Aso) ، تەمەنی (٢٤) ساڵ، هەنگاوەکانی(٣) دوبارە بکەوە، ئنجا کلیك لەسەر (Cancel) بکە. وەك لەوێنەی (٤-١٥) دا دیارە:-

Dynaset:AgeTable

Update | Cancel

Field Name: Value (F4=Zoom)

StName: Aso

StAge: 24

Add record

وێنەی(٤-١٥)

٥.لێرەدا کۆتایی بە دانانی ناوەکان هات، کلیك لەسەر (Close) بکە. وەك لەوێنەی(٤-١٦) دا دیارە:-

Dynaset:AgeTable

| Add | Edit | Delete | Close |
|---|---|---|---|
| Sort | Filter | Move | Find |

Field Name: Value (F4=Zoom)

StName: Erwany

StAge: 18

1/2

وێنەی(٤-١٦)

٦.كليك لەسەر ليستی (File) بكە، ئينجا لەو ليستەی، كە دەكرێتەوە (Exit) هەڵبژێرە. وەك لەوێنەی(٤-١٧) دا ديارە:-




وێنەی(٤-١٧)

## **چۆنیەتی کارکردن لەگەڵ داتابێز:-

لەبەشی سەرەوەدا باسی دروست کردنی داتابێزی (studentDB) و، دروست کردنی (جدول)ی (Age Table) مان کرد. ئێستا باسی کارکردن لەگەڵ زانیاریەکانی (خەزن) کراو دەکەین بەهۆی پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسك) بەرەچاوکردنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:-

١.دوو جار ل... ...ن کلیك لەسەر ئامرازی کۆنترۆلی داتابێز (Data)بکە، کەل... ...ا یارە سەیری وێنەی (٤-١٨) بکە، کە لەناوەڕاستی (Form... ...ە دەردەچێت. وەك لەوێنەی (٤-١٨) دا دیارە:-




وێنەی(٤-١٨)

٢.ئـامرازی كۆنـترۆڵی (Data) تحديـد دەكـەين، ئينجـا لەپەنجـەرەی تايبەتی سيفاتەكان (Properties) دا،دوو جار لەسەر يەك كليك لەسـەر سـيفاتی (DataBaseName) دەكـەين، وەك چـۆن لەوێنــەی (٤-١٩) دا ديارە:-




وێنەی(٤-١٩)

٣.دوای کلیـك کـردن لەسـەر سـیفاتی (DataBaseName)، ئـەم روکارەی خوارەوە دەبێتەوە، بۆ دەست نیشان کردنی ناوی داتابێزەکە بەناوی (StudentDB)، ئینجا کلیك لەسەر (Open) بکە، وەك لە وێنەی (٤-٢٠) دا دیارە:-




وێنەی(٤-٢٠)

٤.ئامرازی کۆنترۆلی (Data) تحدید بکە، ئینجا لەپەنجەرەی تایبەتی سـیفاتەکان (Properties) دا، بـۆ دەسـت نیشـان کردنـی نـاوی (جدول)ەکە (AgeTable) کلیك لەسەر سیفاتی (RecordSource) بکە.

٥.ئامرازی کۆنترۆلی (Data) تحدید بکە، ئینجا لەپەنجەرەی تایبەتی سـیفاتەکان (Properties) دا، لەسـیفاتی (Caption) دا لەشـوێنی (Data1) بنوسە(Student)، لـە سـیفاتی (Name) یشـدا لەشـوێنی (Data1) بنوسە (Stinfo) .

٦. بۆ (Form) ، دوو ئامڕازی (Textbox) ،لەگەڵ دوو ئامڕازی (Lable) زیاد دەكەین و. لەپەنجەرەی تایبەتی سیفاتەكان (Properties) دا لەسەر ئامڕازەكان ئەم سیفاتانەی خوارەوە جێبەجێ دەكەین (بەمەرجێك لەكاتی جێبەجێ كردنی سیفاتەكان دەبێت ئامڕازەكان تحدید بكەین)، كە لەم خشتەی خوارەوەدا دیارە:-

| گۆڕانكاری | Properties | ئامڕازەكان |
| --- | --- | --- |
| StudentName | Caption | Lable1 |
| StudentAge | Caption | Lable2 |
| Txtname | Name | Textbox1 |
| Txtage | name | Textbox2 |
| Stinfo | Data Source | Textbox1 |
| Stinfo | Data Source | Textbox2 |
| Stname | DataFiled | Textbox1 |
| StAge | DataFiled | Textbox2 |

٧.دوای زیادكردنی ئامڕازەكانی كۆنترۆل و جێبەجێ كردنی گۆڕانكاریەكان. وێنەی (٤-٢١) مان بۆ دەردەچێت.

٨. پرۆگرامەكە (خزن) بكە.

٩.جێبەجێ كردنی پرۆگرام بە هۆی دوگمەی (F5).

وێنەی(٤-٢١)

## **چۆنیەتی زیادکردن و رەشکردنەوەی زانیاریەکان:-

**هەنگاوەکانی کارکردن :**

**١.ئێستا سێ ئامرازی کۆنترۆلی (CommandButton) بۆ هەمان (Form) ی پێشوو زیاد دەکەین، کە (CommandButton1) بۆ زیاد کردنی (Add) زانیاریەکانە، (CommandButton2) بۆ رەشکردنەوەی (Delete) زانیاریەکانە، (CommandButton3) بۆ دەرچوون لەپرۆگرامە.**

**٢.ئەم گۆڕانکاریانەی خوارەوە لەسەر هەرسێ ئامرازەکە جێبەجێ دەکەین، کە لەم خشتەی خوارەوەدا دیارە:-**

| ئامرازەکان | Properties | گۆڕانکاری |
|---|---|---|
| CommandButton1 | Caption | Add |
| CommandButton2 | Caption | Delete |
| CommandButton3 | Caption | Exit |
| CommandButton1 | Enable | True |

**٣. دوای زیادکردنی هەرسێ ئامرازەکان و جێبەجێ کردنی گۆڕانکاریەکان، وەك لەوێنەی (٤-٢٢) دیارە:-**

وێنەی(٤-٢٢)

٤.بۆ نوسینی (Code)ی زیاد کردنی زانیاریەکان، دووجار لەسەر یەك کلیك لەسەر (Add) بکە.(Code) ەکە بەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub Command1-Click()
Stinfo.Recordset.addnew
End sub
```

٥. بۆ نوسینی (Code)ی رەشکردنەوە، دووجار لەسەر یەك کلیك لەسەر (Delete) بکە، کەبەم شێوەی خوارەوە دەبێت:-

```
Private sub Command2-Click()
Stinfo.Recordset.Delete
Stinfo.Recordset.Moveprevious
End sub
```

٦.بۆ نوسینی (Code)ی دەرچوون لەپرۆگرام، دووجار لەسەر یەك کلیك لەسەر (Exit) بکە، کەبەم شێوەی خوارەوە:-

```
Private sub Command3-Click()
End
End sub
```

٧.جێبەجیٚ کردنی پرۆگرام بەهۆی دوگمەی(F5) .

٨.ئینجا بۆ زیاد کردنی ناوێك کلیك لەسەر (Add) بکە، بەلاّم بۆ رەشکردنەوەی ناویٚ کلیك لەسەر (Delete) بکە،بەمەرجێك ناوەکە (تحدید) کرابێت.

*****چۆنیەتی دەرچوونی زانیاریەکان لەسەر شێوەی ( جدول ):-**

لەباسی پێشتردا باسی چۆنیەتی دروست کردنی داتابێزێکی ئاسان و، چۆنیەتی دانانی زانیاریەکان لەناو (جدول)ەکە و، باسی دروست کردنی دوگمەکانی زیادکردن و رەشکردنەوە و دەرچوون لەپرۆگرامەمان کرد. بەڵام چۆن بتوانین ئەم زانیاریانە بەشێوەی (جدول) پیشان بدەین؟ پرۆگرامی (ڤیژوەل بیسک) وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە، چونکە لەپرۆگرامی (ڤیژوەل بیسک) دا زۆر جۆر ئامراز هەن بۆ پیشاندانی زانیاریەکانی خەزن کراو لەداتابێزی (StudentDB) ،بەهۆی بەکارهێنانی ئامرازەکانی کۆنترۆڵی وەك (ADO) و ئامرازی کۆنترۆڵی (DataGrid) و ئامرازی کۆنترۆڵی (HflexGrid) وئامرازی تریش هەیە بۆ ئەم مەبەستە بەکاربێت.

لەم باسەدا باسی پیشاندانی ئەو زانیاریانە دەکەین، کەلە داتابێزی (StudentDB)دا (خزن) مان کردوە دەکەین. ئەویش بە بەکارهێنانی ئامرازی کۆنترۆڵی (HflexGrid)، هەروەها لەگەڵ ئامرازی کۆنترۆڵی (ADO) کورتکراوەی (ActivesDataProject) ،کاری بەستنەوەی داتابێزەکە یە لەگەڵ (ڤیژوەل بیسك)، بۆ ئەم مەبەستەش رەچاوی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بکە:-

١.لـه ليسـتى سـەرەكى (ڤيـژوەل بيسـك) دا كليـك لەسـەر ليسـتى (Project) بكـە، ليسـتێك دەكرێتـەوە (Component) هـەڵبژێرە، وەك لەوێنەى (٤-٢٣) دا ديارە:-




وێنەى(٤-٢٣)

٢.دوای هـــەڵبژاردنی (Component) ئـــەم روکـــارەی خـــوارەوە دەبێتەوە،ئامرازی کۆنترۆلی (MicroSoftADOdataControl6.0) ،لەگەڵ ئـامرازی کۆنـترۆلی (MicroSoftHierarchicalFlexGridControls6.0) هەڵبژێرە، وەك لەوێنـەی(٤-٢٤) دا دیـارە، ئینجـا کلیـك لەسـەر (Apply) بکە ،دوای کلیك لەسەر (Ok) بکە.




وێنەی(٤-٢٤)

٣.ئامرازی کۆنترۆلی (ADO) بەناوی (Adodc1) و ئامرازی کۆنترۆلی (HierarchicalFlexGrid) یش بەناوی (MSHFlexGrid) لە خوارەوەی شریتی ئامرازەکانی کۆنترۆل دەردەچێت. ئینجا بۆ (Form)هەریەك لەئامرازی کۆنترۆلی (Adodc1) و ئامرازی کۆنترۆلی (MSHflexGrid) زیاد دەکەین، وەك لەوێنەی(٤-٢٥)دا دیارە:-




وێنەی(٤-٢٥)

٤.ئـامرازی کۆنـترۆلی (Adodc1) تحدیـد بکـە، ئینجـا لەپەنجـەرەی تایبەتی سیفاتەکان (Properties) دا دوو جار لەسەر یەك کلیك لەسـەر سیفاتی (ConnectionString) بکـە، دوای کلیـك کـردن ئـەم روکـارەی خوارەوە دەبێتەوە. وەك لەوێنەی(٤-٢٦) دا دیارە:-

Property Pages

General

Source of Connection

Use Data Link File

Use ODBC Data Source Name

New

Use Connection String

Build...

Other Attributes:

OK Cancel Apply Help

وێنەی(٤-٢٦)

٦. لەو روكارەی كە كرایتەوە (UseConnectionString) هەڵبژێرە، ئینجا بۆ كردنەوەی روكاری (DataLinkProperties) كلیك لەسەر (...Build) بكە، ئینجا لەو روكارەدا (MicroSoft3.51OLEDBProviderforODBCprovider) هەڵبژێرە، ئینجا كلیك لەسەر (Connection) بكە. ئینجا لە خانەی یەكەمدا كلیك لەسەر ئەو سێ خاڵەدا(...) بكە، وەك لەوێنەی(٤-٢٧) دادیارە. بۆدەست نیشان كردنی ناوی داتابێزەكەمان بەناوی (StudentDB) دوای (Ok) كلیك بكە.

Data Link Properties

Provider | Connection | Advanced | All

Specify the following to connect to Access data:

1. Select or enter a database name:

D:\Documents and Settings\media\My Documents\Stu ...

2. Enter information to log on to the database:

User name: Admin

Password:

Blank password   Allow saving password

Test Connection

OK   Cancel   Help

وێنەی (٤-٢٧)

٧.بۆ دڵنیابوون لەوەی کە کارەکەمان (تەواوە)، یان (نا)، ئەوا کلیك لەسەر (TestConnection) بکە. ئەگەر کارەکەمان بەسەرکەوتوویی ئەنجام دابوو ئەوا ئەم نوسینەمان (TestConnectionSucceeded) بۆ دەردەچێت. وەك لەوێنەی (٤-٢٨) دا دیارە،ئینجا کلیك لەسەر (Ok) بکە.




وێنەی(٤-٢٨)

٨.كليك لەسەر (Apply) بكە، ئینجا لەو روكارەی، كە دەكرێتەوە كليك لەسەر (RecordSuorce) بكە. ئینجا لەخانەی یەكەمدا (2-adcmdTable) هەڵبژێرە و، لەخانەی دووەمیشدا (AgeTable) هەڵبژێرە، ئینجا كليك لەسەر (Ok) بكە. وەك لەوێنەی (٤-٢٩) دا دیارە:-

Property Pages

General | Authentication | RecordSource | Color | Font

RecordSource

Command Type

2 - adCmdTable

Table or Stored Procedure Name

AgeTable

Command Text (SQL)

OK | Cancel | Apply | Help

وێنەی (٤-٢٩)

٩.ئەم سیفاتانە لە خانەی تایبەتیەکان (Properties) جێبەجێ بکە:-

| ئامرازەکان | Properties | گۆڕانکاری |
| --- | --- | --- |
| MSHflexGrid | DataSuorce | Adodc1 |
| Adodc1 | Visible | False |

١٠. بەهۆی دوگمەی (F5)پرۆگرامەکە جێبەجێ بکە ، ئینجا ئەم شێوەی خوارەوەمان بۆ دەردەچێت. وەك لەوێنەی (٤-٣٠) دا دیارە:-

Form1

Student Name Safen

StudentAge 12

Data1

Add Delete Exit

| | StName | StAge |
| --- | --- | --- |
| | Erwany | 18 |
| | Aso | 24 |

وێنەی(٤-٣٠)